# کێ قورئان ئەپارێزێ ؟!

**د. أیمن الظواهري** | زنجیرەی چەند کورتە پەیامێك

بـۆ ئومـەتـێکی سـەرفـراز

**برایانی موسوڵمان لە گشت شوێنێك دا،**
**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**
**لە دواییدا ..**

**حەز دەکەم سەرەتای ئەم زنجیرەیە بە کورتە دید وڕوانینێکی بەهاری عەرەبییەوە دەست پێ بکەم – وەك ناوی نراوە -، ئەو بەهارەی لە میسرِ وتوونس ویەمەن دا شکستی هێنا، خوداش خۆی ئەزانێت سەرەنجامەکەی لە لیبیا چی بەسەر دێتەوە، بەڵام لە وڵاتی شام دا ڕێگەی سەرکەوتن وسەرفرازی بە کۆمەك ویارمەتی خوای پەروەردگارەوە دۆزییەوە.**

**بۆ ئەوەی باسەکەتان بۆ کورت وئاسان کەمەوە، بەسەرهاتی میسرِتان بۆ دەگێڕمەوە، چون وەکو نموونەیەکی شاخداری شکست وفەشەلی موسوڵمانانە، کاتێ کە تووشی سستی ولە ڕێ لادان دەبن، نموونەیەکە کە ڕق وقینی خاچ پەرستان دەردەخات؛ کاتێ کە سنوور دەبەزێنن وئەکەونە ستەم وزۆرداریییەوە، ئەو وانانەی لە میسرِیشەوە بە دەست دەهێنرێن دادەبەزنە سەر نموونەکانی ترەوە.**

**بەسەرهاتی میسرِ لە بیست وپێنجی ینایەری ساڵی ٢٠١١ دەستی پێ نەکرد، بە کۆمەڵکوژییەکەی رابیعەی عەدەوی ونەهزە وحەرەسی جمهوریش کۆتای نەهات.**

**بەسەرهاتەکە لەوانە کۆنترە، هەکایەتی میسرِ لەگەڵ پێشەوای چاکخوازی شەهید حەسەن بەنناوە دەستی پێکرد – ڕەحمەتی خوای لێبێت -، ئەو بانگخوازە ژیرەی گەنجانی لە مەلها وشوێنەکانی مەی فرۆشی وئەڵقە دانیشتنی سۆفیگەری شێواوەوە ڕاکێشا وکردنییە کەتائیبێکی ڕێکخراو، کە لە پێناو خوای پەروەردگاردا تێ دەکۆشین وجیهادیان ئەکرد.**

**بەڵام لەگەڵ ئەو دەستکەوتە مەزنانە دا تووشی کۆمەڵێك هەڵەی مەترسیدار بوو، کە بوونە هۆی بیر ودیدهای پووچەڵ وگومڕا وبەڵای ڕووخێنەریان بە دوادا هات.**

شێخ حەسەن بەننا سەرەتای بزاڤەکەی بە پشتگیری مەلیك فوئادەوە دەست پێ کرد، ئەو پاشایەی هیچ لە پێشڕەو وسەرکردەیەکی گەندەڵ زیاتر نەبوو، سەرکردەیەك کە حوکمی بە دەستووری ساڵی ١٩٢٣ دەکرد؛ کە یەکەم دەستووری عەلمانی بوو لە مێژووی میسردا بەڵکو لە مێژووی تەواوی دەستوورە عەرەبییەکان، پاشان خودی فوئاد دەستێکی زەلیلی ئینگلیزە داگیرکەرەکان بوو لە میسڕ ولە دوای خۆیشی بییەوە فاورووقی کوڕی لەسەر هەمان شوێن پێکانی ئەو دا بوو، کە دیسانەوە حەسەن بەننا تا ئەو پەڕ پشتگیری دەکرد، هەر کە دەسەڵاتی گرتە دەست؛ شێخ حەسەن بەننا بەیعەتی ئیخوانەکانی لەسەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم بە مەلیك فاورووق ڕاگەیاند، کە خودی فاورووق ئەو بەیعەتەی پێ قبووڵ نەبوو، ئەگەر چی دڵیشی بە پشتگیری ئیخوانەوە خۆش بوو، چون خۆی پاشایەك بوو کە بە گوێرەی دەستوورێکی عەلمانییەوە ولاتی بەڕێوە دەبرد، لە هەمان کاتیشدا لە ژێر دەست وحوکمی ئینگلیزدا بوو، بەلاّم شێخ حەسەن بەننا – ڕەحمەتی خوای لێبێت - بە بانگەشە کردنی بۆ ئەو خەون وخەیاڵەوە نەوەستا، بەڵکو تەواو قووڵتر ڕۆشت وبە ئەمیری موئمنین بانگی دەکرد ولە هەموو سات وشوێنێکدا ڕێپێوانی بۆ پشتگیری وتەئیدی پاشا ڕێکدەخست، ونازناوی پارێزەری قورئانی بۆ دروست کرد، بۆیە – وەك شێخ حەسەن بەننا دەیوت – چوارسەد ملیۆن موسوڵمان ئامادەی بوو بەیعەتی ئەوە بدەن کە لە بەر دەستی فاورووقدا گیانیان بکەنە قوربانی بەرگری کردن لە قورئان، وکە ئیخوانی موسلیمینیش دڵسۆزترین سەربازەکانی ئەون، گۆڤارەکەیان دەیوت ئەوان ئامادەن کە گیانی خۆیانی بۆ پاشا بەخت کەن، شێخ حەسەن بەننا هانی فاورووقی دەدا کە هەوڵ بۆ خەلافەتی موسوڵمانان وپێشڕەوێتی جیهانی ئیسلامی بدات وکۆنگرەی چوارەمی ئیخوانی بۆ بەیعەت دان بە پاشا ڕێکخست، داوای لە پاشا کرد کە فەرمانێکی شاهانە دەرکات ولە میسڕی موسوڵماندا دا هیچ دیاردەو بڕگەیەکی پێچەوانەی ئیسلام بوونی نەبێت، جا ئەو کات سەد هەزار گەنجی ئیخوان سەربازی ئامادەو وکەتیبەی پڕ چەکی دەستین وبەو پەڕی سۆزەوە چاوەڕێین.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٨ دا؛ لەو کاتەی فاورووق بە وەرگرتنی عەربوونی دانوستانێکی چەکی پووچەڵ وبێ کەڵکەوە گیرۆدە بوو کە بۆ سوپای میسڕی لە فەلەستین دا کڕابوون، ونوقمی بێ ڕەوشتی وشەلاتێتی بوو، ئا لەو کاتەدا شێخ حەسەن بەننا ئەم وشانەی پێ گوت؛

"گەورەم، چۆنت ویست پێشمان کەوە، هەموو ئوممەتت لە پشتە، پەروەردگاریش لە دەورت دا چاکترین پەنا وپارێزەر وکۆمەك وياوەرە" !

**ئیمامی شەهید بەو فێڵ وتەڵەکە ئەنقەستەوە کافی نەبوو، بەڵکو تەڵەیەکی تریشی پێ ئیزافە کرد؛ کە هیچ کەمتر لەوەی پێشی بە ترس نەبوو، ئەو کاتەی لە چەند وتەیەکی پوخت وتەم ومژاوی دا ئەوەی دووپات کردەوە کە بنەماکانی حوکمڕانی دەستووری تەواو لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئیسلام دا تێك دەکەنەوەو، سیستمی حوکمڕانی دەستووری نزیکترین سیستمی حوکمڕانی جیهانە لە ئیسلامەو، ئیخوانەکانیش بە هیچ سیستمێکی حوکمڕانی تری ناگۆڕنەوە !**

**هەر بەوەندەش نەوەستا، بەڵکو جارێکی دی تا ئەو پەڕ کەوتە بە هەڵە چوونێکی ترەوەو وستایشی دەستوورە عەلمانییەکەی ساڵی ١٩٢٣ی کرد، لافی ئەوەی لێ دەدا کە بنچینە سەرەکییەکانی دەستووری میسرِی هیچ پێچەوانەییەکیان لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام دا نییەو وە لە سیستمی ئیسلامییەوە دوور نین وناموٚ نین، هەروەها دەستوور نووسە میسرِییەکانیش ئەو پەڕی دەست پارێزییان لەوە کردووە کە هیچ یەك لە دەقەکانی ئەو دەستوورە پێچەوانەی بنەما ئیسلامییەکان بن.**

**کە ئەوەش لە ڕاستیدا ڕکابەری کردنێکی زۆر بە جورئەتە بوو، هەر کەسێ شارەزاییەکی گشتی لە بنەماکانی حوکمڕانی ئیسلامیدا هەبووبێ دەزانێ چەندە هەڵەیە. بەڵکو خودی شەهیدی پێشەوا – ڕەحمەتی خوای لێبێت - لە دوا تردا دانی بە پووچەڵ بوون ونا ڕاستی ئەو دیدە نا –**

**بە هەڵە چوونی ئیمام حەسەن بەننا بە تەنها بە هەڵە چوونێکی تیۆریانە نەبوو، بەڵکو سووڕ بوو لەسەر ئەوەی بە کردار دووپاتی کاتەوە، ئەوە بوو کۆنگرەی شەشەمی ئیخوان بڕیاری بەشداری کردنی لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەرکرد، چونکە بە پێی تێڕوانینیان ئەوان : مینبەری ئوممەتە وهەموو دید وتێڕوانینێکی ڕاستی لێوە دەبیسترێتو هەموو ئاڕاستەیەکی دروستی لێوە دەرەچێت، وەك بڵێی – لە تێڕوانینی ئەواندا – کۆپییەکی تری بازاڕی عوکاز یان هاید پارك یا بەرنامەیەکی گفتوگۆ کردن بێ، هەر کەسێ شتێکی پێ خۆش بێ ئەیڵێت ومل ئەنێ.**

**لەو ڕێڕەوەدا وقووڵتر نقوم بوون لەو بە هەڵە چوونانە – کە حوکمی شەرع وڕاستییەکانی واقیعیان لە پشتا وێڵ کردبوو – حەسەن بەننا دوو جار خۆی بۆ هەڵبژاردن کاندید دەکات، جاری یەکەمیان "نەحاس"ی سەرۆك وەزیران فشاری ئەخاتە سەر وە تەنازول لە کاندید بوون ئەکات، جاری دووەمیان**

سووڕە لەسەر خۆ کاندید کردن، بۆیە ناچار ئەبن بە تەزویر لای دەن. ئیتر ئەبێ ئیخوان حەقیقەتی بەریتانیای دایکی دیموکراسیان بۆ دەرکەوتبێ ولە یارییەکە گەیشتن، یا هێشتا سووڕن لەسەر تێ نەگەیشتنیان ؟

دوای هەموو ئەمە ڕۆژگارێکی تر دێت وئیمامی شەهید ئەوەی بۆ دەرەکەوێ کە ئەوە هەموو گاڵتە جاری وکات بەسەر بردن بوو هەروەها سەرپێچی کردنی حوکم وبنەماکانی شەرع بوو، بۆیە وتارێکی بە ناوبانگی خۆی لە ژێر ناونیشانی (شەڕی قورئان)دا بەر لە هەشت مانگ لە شەهید بوونی دا دەنووسێت، لەوێ دان بەوە دەنێ کە ئەوەی لە دەستوور ویاسای میسرِدا هەیە ناکرێ میسرِ بکاتە دەوڵەتێکی ئیسلامی، وئەوەی هەیە هیچ پەیوەندییەکی بە حوکمی خواوە نییە، بەڵکو دەرچوون وشۆڕشە بە ڕووی حوکمی خوای پەروەردگار، ئوممەتیش پێویستە شەڕی قورئان لە بەرامبەر حاکم ودەسەڵاتدارەکانی دا بکات بۆ ئەوەی بە حوکمی قورئانیان ببەستێتەوە.

دواتر کۆتایی ژیانی ئیمامی شەهید لەسەر دەستی ئەو کەسە بوو کە پێشتر بە پارێزەری قورئان ناوی ئەبرد، ئەوە بوو مەلیك فارووق لە مانگی شوباتی ١٩٤٩ دا کوشتی وشەهیدی کرد.

ئیدی با ببینین ئایا شوێنکەوتوانی حەسەن بەننا بەرائەتی خۆیان لە بکوژی ئیمام نواند ؟ یاخود ئوستاد هضیبی – ڕەحمەتی خوای لێبێت – بە پاشای بەڕێز بانگی ئەکرد ؟

ئیخوانەکان بەردەوامییان بە دوو ڕوویی وماستاو کردنیان بۆ فاروق دا، پاشان پشتی عبد الناصر یان گرت لە دژی فاروق، دواتر عبد الناصر پشتی لێ کردنەوە وئەو کات ئەنوەر سادات یەکێ بوو لە لە دادوەرەکانی عبد الناصر، ئەو کەسەی کە بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ فەقیە وماموٚستای جەماعەکەیان دەرکرد کە موستەشار عبد القادر عودة بوو لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی تری ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

دوای مردنی عبد الناصریش دەستیان خستە دەستی ساداتەوەو، ئەویش ئازادی جووڵانەوەو بزاڤی پێدان.

**کاتێ کە ساداتیش کوژرا دەستیان کردە ملی حوسنی موبارەکی بکوژی کەمال سەنانیری وە لە ڕێپێوانی نیفاق دا؛ لە مەجلیسی شەعبەوە تا کۆشکی کۆماری ڕێیان پێوا، بۆ ئەوەی دوو بارە بۆ ماوەیەکی دووەم بەیعەتی پێ بدەنەوەو، لەگەڵ ئەویشدا ئەندازەیەکی فراوانی ئازادییان بە دەست هێنا، ئەویش دانوستانێکی پیس بوو بۆ ئەوەی کەلێنە هەناسەیەك بۆ گەنجان بکەنەوە؛ تووڕەییان سارد بێتەوە وبکوتنە سەر موجاهیدان، دواتر جارێکی تر پشتیان لەویش کرد وچوونە ڕیزی بەرادعییەوە کە نێردراوی دەستی ئەمریکا بوو، ئەو کاتەی شۆڕشیش هەڵگیرسا لە ڕیزی پێشەوەی دانوستان کەران بوونو بۆیە دەستبەجێ دەستیان خستە دەستی مەجلیسی عەسکەرییەوە.**

**جا ئاخۆ شەڕی قورئانیان لە بەرامبەر بکوژەکانیان دا کرد ؟، وەك چۆن شێخەکەیان ئەمری پێ کردبوون ؟ بە داخەوە فەرمانەکەیان پشت گوێ خست ولە هەمان بە هەڵە داچوون وسەرپێچی کردنی حوکمی شەرع وڕاستییەکانی واقیع دا بەردەوام بوون.**

**گەر شێخی شەهیدیان – ڕەحمەتی خوای لێبێت – پێشتر ڕکابەری ڕاستیەکانی دەکرد وفاروقی بە پارێزەری قورئان وەسف دەکرد وهەروەها دەستووری میسری بەوە وەسف دەکرد کە دەستوورێکی هاوڕای ئیسلامە  ناو دەبرد، قوتابییەکانی ئەو بەوەندە نەوەستان؛ بەڵکو زۆر دوورتر ڕۆشتن وە زمانێکی عەلمانی ڕاشکاوانەیان گرتە خۆ، زمانێك کە جەخت لەسەر دەوڵەتێکی هاونیشتیمانی ئەکاتو، وەك هەر عەلمانییەکی بێ دین ڕایانگەیاند؛ کە تا بڕیاری زۆربەی دەنگدەرانیان لەسەر نەبێ حوکم بە شەریعەت ناکەن، وپەیوەستن بە تەواوی ئەو ڕێکەوتنانەی لەگەڵ ئەمریکا وئیسرائیلدا کراون، هەر لەسەر ئەوەش کەوتنە پرۆسەی هەڵبژاردنی دوای شۆڕشەوە، کە محمد مورسی ی بە سەرۆکایەتی کۆمار گەیاند.**

**جارێکی تر خۆیان بە هەڵەدا برد وئاوا خەیاڵیان دەکرد تەواو گەیەشتنە هەر چی هیوا وئاواتێکیان بوو لە تەمەنیاندا، محمد مورسیش ئەگەر وەسفێکی شەرعی بکرێت لە حاکمێکی عەلمانی دەوڵەتێکی عەلمانی زیاتر نییە، هیچ فەرقێکی لەوەدا لەگەڵ حوسنی موبارەك نییە، ئەویش هەر وەك موبارەك دان بە شەرعیەتی نێودەوڵەتی وڕێکەوتنەکانی زەلیلی وخۆ بەدەستەوە دان لەگەڵ ئیسرائیل دا دەنێت ودان بە شەراکەت لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەنێ.**

**جیاوازی نێوان ئەو وموبارەك لەوەدا بوو کە ئەو زیاتر پەیوەستی دیموکراسی بوو بۆیە دەرگای ئازادی بە ڕووی هەمووواندا کردەوە، بە ڕەمز وسەرەکانی ڕەوتی جیهادیشەوە، شایەتیش ئەم یەکێ بێ لەو تاوانانەی مورسی کە ئەمریکا ودارودەستەکەی هەرگیز لێی خۆش نەبوون.**

**ئیخوانەکانیش لە لاچوونی حوسنی موبارەك وتا دەستگیرکردنی مورسی، هیچ هەنگاوێکی جدیانەیان بەرەو نەهێشتنی دەوڵەتی گەندەڵ وپتەوکردنی ڕژێم وسیستەمی تازەوە نەنا، ئەوە باسی سیستەمی ئیسلامی مەکە، هەمان تاوانبارەکانی پێشوو لە دادگا وسوپا وپۆلیس ودەزگاکانی ئاسایشدا مانەوە، ئەوانەش پەروەردەی پەیڕەوی گورگ وڕێوی بوون، کە چی ئیخوانەکان خۆیان لەسەر بیردۆزەی دەواجن پەروەردە کردبوو، کە تێیدا مریشکەکان زۆر بە دڵخۆشییەوە بەوەی پێیان ئەدرێ زۆر دەبن وژمارەیان زیاد دەکات، بێ ئەوەی ئاوڕ لە دز ودڕندەکانی دەوریان بدەنەوە.**

**ئەگەر بەسەرهاتی ئیخوانیش ئاوا بێ، دەبێ بەسەرهاتی کاسەلێس وماستاوچییەکانی سەلەفیەکانی موخابەرات وڕیال چۆن بێت، یا بەسەرهاتی نەهزەییەکانی کوشتەی عوقدەی خۆ بە کەم زانین وقوتابییانی شێخەکەی مارێنز چی بێ ؟**

**بۆیە پێویستە سەیرێکی شوێن پێکانمان بکەینەوە وبە هەڵەکانماندا بچینەوەو ڕاستیان کەینەوە، نەك جارێکی تر دووبارەیان کەینەوە، هەموو موسوڵمانێکی دڵسۆزی بە غیرەت لە میسرِ و وڵاتانی بەهاری عەرەبی وجیهانی ئیسلامی؛ بەڵکو لە سەرتاسەری جیهان دا، پێویستە لە عەقیدە وڕەفتاری دا شێرانە بێت، چون ئەو کەسەی شێر وشێرانە نەبوو خۆراکی گورگە، پێویستە نەوەکانمان وەکو شێر پەروەردە کەین نەوەك پەروەردەیەکی مەڕانەیان پێ بدەین، جەنگەکەمان بە کتێب وشمشێرەوە بپێوین، کتێبێك کە ڕێگەمان ڕۆشنکاتەوەو شمشێرێك کە سەرمانخا، جا نازانم ئەگەر پەیامەکەم گەیشتبێت یان نا، خوایە من ئەوەی بووم گەیاندم وخۆت شایەت بە.**

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین، وصلى الله على سیدنا محمد وآله وصحبه وسلم**
**والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**